له بڵاوكراوەكانی گروپی هانەی ئیعلامی (8)




تـــابلۆكانی ناوەوە : رۆدان و تنۆك پیربال

تابلۆ ودیزانی بەرگ : فاروق سامانی

تیــــــــــراژ : ١٥٠٠ دانه

ئەم چیرۆكە لە تەمموزی ٢٠٠٥ نووسراوە لەهەمان مانگدا لە هەولێر و سلێمانی و هەڵەبجە و كەلار، لە مانگی سێپتەمبەریش لە رانیە و چوارقورنە خوێندراوەتەوە.

ژمارەی سپاردنی بە كتێبخانەی گشتی هەولێر

٧٠٠ ساڵی ٢٠٠٥

لە گەڕەکی تەیراوە، بەرامبەر مزگەوتی حاجی عبداللە، لە کۆلانەکەی تەنیشت حەمامی موختار، پیاوێکی زگورتی دەژیا، تەمەنی پەنجا ساڵێک؛ لە پۆلیسخانەکەی پشت گازینۆی کورد و عەرەب معاونی پۆلیس بوو، پێیان دەگوت (ڕەئیس ڕەمەزان).. خوا بەهرەی ئەوەی پێ بەخشیبوو بتوانێ خۆی بکاتە دوو - سێ کەسی دیکە، واتە توانای ئەوەی هەبوو لە یەک کاتدا چەند کەسێکی دیکەی وەک خۆی لە خۆیدا دروست بکات و بەرهەڵدای دنیایان بکات.

ڕەئیس ڕەمەزان زۆر جار لە ماڵەکەی خۆی دادەنیشت و ڕەئیس ڕەمەزانێکی دیکەی دەنارده سەر ئیش بۆ پۆلیسخانەکە.. یان هەندێ ئێواره -کاتێ زۆر دژوێن دەبوو - بۆ خۆی دەچووه حەمامەکەی تەنیشت ماڵی خۆیان و ڕەئیس ڕەمەزانێکی دیکەی دەنارده بازاڕ بۆئەوەی پلێمزەکەی بۆ چاک بکاتەوه و بێتەوه ماڵ چێشتەکەی بۆ گەرم بکاتەوه؛ لە هەمان کاتدا ڕەئیس ڕەمەزانێکی دیکەیشی دەنارده سەر قەبران بۆئەوەی بچێ فاتیحەیەک لەسەر گیانی دایک و باوکی ڕەحمەتیی خۆی بخوێنێ کە «دەیگوت» هەردووکیان پێکەوه لە کاتی تاق و تۆقەکانی گەڕەکی سەیداوه، بەدەستی حەڕەس قەومییە بەعسیەکان شەهیدکرابوون؛ لە هەمان کاتیشدا ڕەئیس ڕەمەزانی سێیەمی دەنارده لای جەمال سێوانی پەڕەچی بۆئەوەی بەرگەبالیفەکانی ماڵەوەی بۆ بدروێتەوه و جلوبەرگەکانیشی بۆ ئوتوو بکات.

ڕەئیس ڕەمەزان پیاوێکی کەشخەی بالآبەرزی ئەسمەر، قژێکی بەگوریزەی قەترانیی بەردابۆوە کە تا سەر شانی هاتبوو. هەندێ کەس دەیانگوت: «ڕەئیس ڕەمەزان یەزیدییە بۆیە حکوومەت ڕێگەی پێ دەدات سەروقژی بهێڵێتەوە» بەڵام زۆربەی خەڵک ئەم قسەیان پێ ڕاست نەبوو: چونکە «دەیان جار خەڵک دیبوویان لە مزگەوتی کوێتی، نوێژی کردووە».

ڕەئیس ڕەمەزان، هەم لەناو پۆلیسخانە لەگەڵ ئەفسەر و پۆلیسەکاندا، هەم لەناو بازاڕ لەگەڵ خەڵکدا، پیاوێکی بەهەیبەت و شکۆمەند، سامێکی زۆری هەبوو. ئەم هەیبەت و سامەش لە هەموو هەولێر دەنگی دابۆوە، بەتایبەتیش لەناو ژناندا. کاتێ دەیانگوت: «ڕەئیس ڕەمەزان» ئیدی هەموو کەس، بەتایبەت ژنانی گەڕەکی (تەیراوە)، زۆر ژنی گەڕەکەکانی دیکەش، هەموویان دەیانناسی.. بە زەردەخەنەیەکی ژنانەوە دەیانگوت:

- ها.. ئێ ئێ.. ڕەئیس ڕەمەزان!

- پیاوە قژ بەگوریزەکە!

- معاونی پۆلیسخانەکەی گەڕەکی تەیراوە؟

- کچێ ئەوەی هەمیشە هۆقەیەک ڕۆن لە قژی خۆی دەدا..!

- نا، باوەڕ ناکەم، ڕۆن لە پرچی خۆی نادا، خۆی قژی جوانە، دەبریسکێتەوە.

- پیاوێکی قۆزە.

- ویش.. قۆزی چیە، دەڵێی گورگە.

ئاوها ئیتر، ژن هەبوون خۆشیان دەویست، هەشبوون سڵیان لێی دەکردەوە: چونکە پیاوێکی نامۆ و ناجۆر و -بەبیرم دێ- کەمێکیش ناقۆڵا بوو.

من ڕاهاتبـووم: هەر کـاتێک باوکم لەناکـاو بەسـەر سـەرمدا نوشتابایەتەوە و دەستی بخستایەتە سەر شانم و سەرنجی منی بۆ هەر پیاوێک ڕابکێشایە؛ ئیتر من پێش ئەوەی باوکم پەنجە بۆ ئەو پیاوە درێژ بکات و بڵێ «فەرهاد، کوڕم، ئەم پیاوە دەبینی..» من یەکسەر تێدەگەیشتم کە ئەو پیاوە منداڵبازە! بەڵام لەگەڵ ئەمەش، بە باوکم گوت: «منداڵەکانی خەلیفەسەعۆی دراوسێمان پێیان گوتم کە ئەم ڕەئیس ڕەمەزانە منداڵبازە».

باوکم گوتی:

- کوڕم، گـوێ بگرە! هەمـوو ئێـوارەیەک ئەم وەختـانە، ئەم ڕەئیس ڕەمەزانە، دێ، لێرە، لەپێش دەرگای ئەم حەمامە ڕادەوەستێ و پشت دەداتە دیواری دوکانی ئەم کرێمستی فرۆشە. ئەگەر بینیت، یان ئەگەر نزیکت کەوتەوە و ویستی قسەت لەگەڵ بکا، توخنی نەکەویت.. ها! منداڵان دەڕفێنێ. وەڵامی نەدەیتەوە! باش!

وتم: باش، بابە. دەزانم.

من تەنیا کاتێ هەراشتر بووم و گەیشتمە پۆلی شەشەمی سەرەتایی ئنجا هەستم بەو مەترسییە گەورەیە کرد کە لەناو دڵی دایکم و باوکمدا هەبوو لەهەمبەر «ڕەئیس ڕەمەزان». بەڵام ئەوکاتیش هەر دەمدیت: خەڵک، هەر کەسێک بەشێوەیەکی جیاواز باسیان دەکرد. هەندێ دەیانگوت «مێبازە»، هەندێکی دیکە دەیانگوت «نەوەڵا، چونکە زگورتییە و پیاوێکی ڕەبەنی فەقیرحاڵ و بێکەسە بۆیە خەڵک ئەوەندە قسەی لەدوو دەکەن»؛ هەشبوون دەیانگوت «جاسووسە.. بەئەسڵ کوردی مازەندەرانە و ڕەزاشای ئێران بۆ جاسووسی ناردوویەتی بۆ ئێرە»؛ خەڵکی واش هەبوون دەیانگوت «نەخێر، وەلییە».

ئەم قسانە هەمووی لەلایەک، بەڵام ئەمەش بەتەنیا لەلایەک کە زۆربەی خەڵک لەسەر ئەوە کۆک بوون و دەیانزانی کە ئەم پیاوە خوا بەهرەی ئەوەی پێ بەخشیوە بتوانێ خۆی بکاتە دوو - سێ کەسی تر،

واته توانای ئەوەی هەبوو لە یەک کاتدا لە دوو سێ شوێنی جیاواز بێت. وابزانم هەر بۆیەش، لەم بارەیەوە، خەڵک سوور بوون لەسەرئەوەی کە ئەم پیاوە وەلییە! تەنانەت ساڵێک لەو ساڵانە وا بڵاوبوویەوە کە ڕەئیس ڕەمەزان لە گەڕەکی تەیراوەوە، لە سەربانی ماڵەکەی خۆیانەوە، یەکڕاست هەڵفڕیوە بۆ حەج..

- هەموو حەجاجەکانی هەولێریش لە حەج بینیوبانە..

- ئەمە بێ ئەوەی بلیتی فڕۆکەی لە هیچ شوێنێکیش بڕیبێت!

دادە بەدۆکەیەکی دراوسێمان هەبوو، ئێواران جاربەجار دەهاتە لای دایکم (قاچیان لێ ڕادەکێشا و برنجیان پێکەوە دەبژارد) هەزار سوێندی دەخوارد و دەیگوت:

- ئەم ڕەئیس ڕەمەزانە، دیویانە: بە شەوان دەفڕێ.

ئێـواران درەنگ، پێش ئەوەی مـەلای مـەغـریب بانگ بدا، باوکم و مام مەولوودی ماستاوفرۆشی دراوسێمان و پیاوانی دیکەی گەڕەک عـادەتیـان بوو لەژێر سێبـەری پانوپۆڕی دارهەنجیرەکەی بەردەم ماڵی مام مەولوودی ماستاوفرۆش کۆدەبوونەوە قسە و باسیان دەکرد.

ئێوارەیەک، بەبیرمە، سۆفی شەمسەدین (کە هەمیشە تەسبیحێکی درێژی بەدەستـەوە دەگـرت) لەناو مـەجلیـسـەکـەوە دەسـتی بۆ دوور ڕاکێشا، گوتی:

- لەم گـەڕەکی سـەیداوەیە، مـام کـەریمێکی زیندروو هەیە، ناسیاوێکی خۆمانە. زۆر جار بە شەوان هاتوچۆی یەکتر دەکەین. ژنی ئەم مام کەریمە زیندرووەی ناسیاوم، ڕووی هەر سوور بێ خوایە - ئەو شەوە لە ماڵیان بووین- هەزار سوێندی دەخوارد دەیگوت: «عەسرێکی درەنگ بوو، چوومە ماڵی دادە بەهیجەی هاوسێمان» دەیگوت «کاتێ کەوتمە ناو حەوشەکەیان، چۆلەکە لەسەر دارەکانی ناو باخچە جریوەجریویان بوو، لەناو باخچەکە دیتم ئەم ڕەئیس ڕەمەزانە لەگەڵ

حاجی حەبیبی مێردی دادە بەهیجە پێکەوە لەژێر دارەکان پیاسەیان دەکرد». گوتی: «منیش کەمێک شەرمم لە خۆم کردەوە، چمکی کراسەکەم لە دەمم گرت و یەکڕاست تێپەڕیمە ژوورەوە بۆ لای دادە بەهیجە. کاتێ چوومە ژوورەوە، وەیش؛ چ ببینم! دیتم: دادە بەهیجە هەتا ناوکان ڕووت، هەردوو قاچی لەناو قەدی ڕەئیس ڕەمەزان ئالاندووە و لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا، هەردووکیان پێکەوە هێنکەهێنکیان پێ کەوتووە.. عەینەن حەلالّی یەکتر!». ژنە دەیگوت: «خوایە! تازە پێش تەنیا یەک چرکە ڕەئیس ڕەمەزان لەناو باخچەکە پیاسەی لەگەڵ حاجی حەبیبی مێردی دادە بەهیجە دەکرد، کەچی لە هەمان کاتدا لە ژوورەوە لەگەڵ ژنەکەی حاجی حەبیب کەیف و سەفایان بوو! هەر لەودیو پەنجەرەی باخچەکەوە؛ تەنیا پەردەیەک لەنێوان حاجی حەبیب و ژنەکەیدا هەبوو..!». ژنی مام کەریمی زیندروو دەیگێڕایەوە دەیگوت: «قیژەم لێ نەدا، عاقڵ بووم هاواریشم نەکرد، بە ڕاکردن هەتا لای دەرگای حەوشەکە ڕانەوەستام، بەڵام کاتێ

خەریک بووم دەرگای حەوشەکەم لەسەر خۆم دادەخستەوە، تەماشایەکی ژێر دارەکانم کرد، دیتم: ڕەئیس ڕەمەزان، هاوپیاسەی حاجی حەبیب، لەژێر دارەکانەوە بە دزەنیگایەکی ئیبلیسانەوە مۆڕەیەکی ناشیرینی لێکردم». ژنە دەیگوت: «زەندەقم چوو، اعوذ بالله، اعوذ بالله دەرگاکەم داخستەوە و ڕامکردە دەرەوە..».

- استغفرالله..

- ئنجا لە هەمووی خۆشتر، ژنی مام کەریمی زیندروو دەیگوت: «کاتێ گەیشتمەوە ماڵی خۆمان و ڕووداوەکەم بۆ کەریمی مێردم گێڕایەوە، کەریم پێی دەگوتم: «کچی ئەوە تۆ شێت بووی؟!». باوەڕی پێ نەدەکردم. کەریم دەیگوت: «من تازە لەسەر ئەم شەقامەی بەردەم ماڵی خۆمان ڕەئیس ڕەمەزانم دیوە گەنجێکی نۆزدە ساڵەی لە عاموودێک بەستابۆوە و بە دار کەوتبووە گیانی». دەیگوت: «کەریم باوەڕی پێم نەدەکرد».

- هەقی بووە باوەڕی پێ نەکا.

- بەڵێ.

- یەعنی لە یەک چرکەدا سێ ڕەئیس ڕەمەزان ئیشیان کردووە!

- بەڵێ، مام کەریم سوێندی دەخوارد دەیگوت «لە هەمان ئەو ئان و ساتەی ژنەکەم دوو ڕەئیس ڕەمەزانی لە دوو حاڵەتی جیاوازدا دیبوو، منیش لە شەقامەکەی ئەوبەرمانەوە، ڕەئیس ڕەمەزانم بینی دارکاریی گەنجێکی دەکرد کە لە حکوومەت یاخی ببوو..».

مام مەولوودی ماستاوفرۆش، لەناکاو ڕووی کردە سۆفی شەمسەدین، گوتی:

- قورئان، بە هەقت بە ساحێبت، کە هیچ سوێندیشتان لەسەرم نیە؛ من خۆم، هەر خۆم، بە هەر دوو چاوی خۆم بینینم؛ چیتان بۆ دەگێڕمەوە ئاوها بوو:

زستان بوو، باران نم نم دەباری.. ئەم ڕەئیس ڕەمەزانە، هێور هێور، لەسەرەخۆ، دەستی لەناو گیرفانی پاڵتۆ، خۆی کرد بە ماڵی ئەو ئامینە دندووک سوورەی لەمەڕ خۆمان. بە چاوی خۆم بینیم: چووە ژوورەوە.

پاشان کە ئاورم دایەوە، دیتم: عەینەن ڕەئیس ڕەمەزان (کە پێش یەک چرکە خۆم بینیم چووە ژوورە) دیتم لە هەمان کاتدا، لەلای دەستەڕاستمەوە، لەگەڵ ڕەحمانە پووتی مێردی ئامینە دندووک سۆر، پێکەوە لەبەر دەرگای ماڵی ڕەحمانەپووت پیاسەیان دەکرد.

- بارانیش نم نم دەباری...

مام مەولوودی ماستاوفرۆش، زارەترەک، دەتگوت هەر ئێستا ڕووداوەکە بە چاوی خۆی دەبینێ، دەمی کەفی کردبوو:

- من لەکاتێکدا خەریک بووم غاربدەم بچم بە مام ڕەحمانی مێردی بڵێم: «ڕەحمانەپووت، هەی هەش بەسەر، بڕۆ بزانە ڕەئیس ڕەمەزان چیی لێتان دەوێ کە ئاوها خۆی کرد بە ماڵەکەتاندا»؛ کەچی دیتم مام ڕەحمانی بەستەزمان وا لەگەڵ خودی ڕەئیس ڕەمەزان پێکەوە لەبەردەرکی ماڵی خۆیان پیاسە دەکەن!

- بارانیش نم نم دەباری...

باوکم پرسی:

- دەی، جەماعەت، ئەمە مانای چیە؟

مام مەغدیدی باخچەوان، کە پیاوێکی ڕەشتاڵەی چاو قاوەیی تێکسمڕاو بوو (دوو جاران بە گۆپاڵەکەی دەستی لە منی دابوو؛ جاری یەکەم: لەسەرئەوەی من گوجیلەم بردبووە ماڵەکەی ئەوان بۆئەوەی لەگەڵ یاسۆی کوڕی پێکەوە گەمان بکەین، جاری دووەمیش لەسەرئەوەی من پرتەقاڵم لە باخچەکەی ماڵیان لێ کردبۆوە) تەماشای سەری نووکی گۆپاڵەکەیم دەکرد، بە عەردە زیخاوییەکەی پێش خۆیدا دەهێنا، گوتی:

- مانای وایە کە ڕەئیس ڕەمەزان بەڕاستی ڕەئیس ڕەمەزانێکی دیکەی هەبووە و ناردوویەتیە لای مێردی ئامینە دندووک سوور، بۆ خۆیشی ئیتر چۆتە وێزەی ژنەکەی.

سۆفی شەمسەدین، تەسبیحە درێژەکەی خۆی لە باوکم وەرگرتەوە، گوتی:

- یانیش بەپێچەوانەوە..

- چۆن؟

- ڕەئیس ڕەمەزان خۆی چۆتە لای ئامینە دندووک سوور و ڕەئیس ڕەمەزانەکەی دیکەی ناردۆتە لای ڕەحمانەپووتی مێردی، بۆئەوەی مەژغوولی بکات.

باوکم هاتەوە ناو قسان گوتی:

- ئنجا جیاوازیی چیە؟

- چۆن؟

- هەر کامێکیان چووبێتە وێزەی ژنە، فەرقی نیە، چونکە هەردووکیان هەر ڕەئیس ڕەمەزانن.

سۆفی شەمسەدین بیری دەکردەوە، گوتی:

- نەخێر.. نابێ هەردووکیان هەر ڕەئیس ڕەمەزان بن!

- ئەوەی دووەمیان دەبێ پیاوێکی لەئەوچووی «دەستی ڕاستی» بێت..

مام مەغدیدی باخچەوان بەتانووتەوە گوتی:

- یەعنی وەزیرەکەی!

- ئەدی ئەوەی سێیەمیان؟

مام مەغدیدی باخچەوان، دیسان بەگاڵتەوە گوتی:

- ئەویشیان مودیرەکەیەتی.

لەناو پێکەنینی هەموویاندا (ئەحمەد عارەب) کە زڕباوکی ئیبۆی هاوڕێم بوو، پیاوێکی گامێشەوان، سبەینان دایکم قەیماغی لەلا دەهێنا، بەبیرم دێ گوتی:

- هەرچۆنێک بێ، مام پیربااڵ ڕاست دەکا: ئەگەر ڕەئیس خۆی بووبێ ئەم کڵاوەی خستبێتە سەرمان یان پاسەوان یان وەزیر یان مودیرەکەی.. فەرقی چیە؟

مام مەولوودی ماستاوفرۆش گوتی:

- کەواتە جمکن.

- نەخێر جمک نین.

- چۆن؟

- چونکە زیاتر لە دوو ڕەئیس ڕەمەزان هەن.

- ئێ باشە لەوانەیە جمکی سیانە بن؟

- نەخێر.. جمکی سیانەش نین. هەموو ئەو ڕەئیس ڕەمەزانانەی لە خۆی دەچن و بەگژ عالەمدا دەچنەوە، خۆی دروستی کردوون.

ئەحمەد عارەب گوتی:

- دروستیان ناکا بەڵکو لێی جودا دەبنەوە.

مام مەغدیدی باخچەوان لێی پرسی:

- کامەیان لە کامەیان جودا دەبێتەوە؟

ئەحمەد عارەب گوتی:

- ڕەئیس ڕەمەزانەکانی تر لە ڕەئیس ڕەمەزانە ئەسڵییەکە جودا دەبنەوە.

- ئێ؟

- ئێ، ئێ.. لێی جودا دەبنەوە و دەچنە وێزەی خەڵک.

سۆفی شەمسەدین گوتی:

- بەخوا کاکە، ئەجندەن.

- ئەجندە؟

- یەعنی ئەو سەگبابە، ئەجندەشی هەیە؟

- کەواتە، ڕاستە دەڵێن: وەلییە.

- لەجیاتی خۆی کارەکانیان پێ دەکا. داوایان لێ دەکا کارەکانی بۆ بکەن.

- بە ڕای من: لێچووی هەیە.

- کاکە.. وەلییە، وەلی. ئەجندەی هەیە.

- نەخێر، شەبیهی هەیە.

- زیاتر لە شەبیهێک و دوو شەبیهـ ؟!

- من پێم گوتن: ئەمانە لێچوو نین، ئەجندەن! ئێوە باوەڕتان بە ئەجندە نیە؟

- کەواتە، دەبێ ئەمە ڕاست بێ کە ڕەئیس ڕەمەزان وەلییە.

- ئێ... ڕەئیس ڕەمەزان وەلییە.

- من باوەڕ بەمە ناکەم..

- دە کەواتە، لە خودی خۆی جودا دەبنەوە.

- استغفرالله..

- ئاخر چۆن؟!

سۆفی شەمسەدین وەک تووڕە بووبێت، پێی لەسەر قسەکەی پێشووی داگرتەوە: «وەلییە، وەلی. خودان تەعالا ئەم بەهرە و توانایەی بە ئەو بەخشیوە و تەواو».

ئەحمەد عارەب لە مام مەغدیدی باخچەوانی پرسی:

- باشە، مام مەغدید، تۆ نالێی ئەم ڕەئیس ڕەمەزانانە خودی ڕەئیس ڕەمەزانە ئەسڵییەکەن و ئەجندە نین؟!

- من نازانم، مالم قەبرە، بەڵام من واتێدەگەم کە هەموویان وەک ڕەئیس ڕەمەزانە ئەسڵییەکەن. چونکە من زۆربەیانم دیوە، مەبەستم ئەوەیە بڵێم من زۆر جار تووشیان هاتووم؛ بە موو چیە فەرقیان لەگەڵ یەکتر نیە.

- ئنجا کێ نالێ تۆ تەنیا یەک ڕەئیس ڕەمەزانت دیوە؟

- چۆن؟

- یەعنی لەوانەیە ئەو ڕەئیس ڕەمەزانەی تۆ دیوتە هەمان ئەو ڕەئیس ڕەمەزانە بووبێ کە بۆ جاری دووەم و سێیەمیش دیوتە بەڵام واتزانیوە ئەمە ئەوەی دیکەیان بووە.

- هەرچۆنێ بێ، ئەوانەی من دیومن: یەک ڕەئیس ڕەمەزانن!

ئەحمەد عارەب دیسان لە مام مەغدیدی باخچەوانی پرسیەوە:

- تۆ نالێیی ئەم ڕەئیس ڕەمەزانانە لێچوو نین یان جمک نین؟

مام مەولوودی ماستاوفرۆش نەیهێشت مام مەغدید وەڵام بداتەوە، هەڵیدایێ:

- کوڕە کاکە جمکی چی و لێچووی چی؟ ئەم پیاوە لەوە دەچێ ساحیر و جادووگەر و شتی وا بێت.

- خوا بەهرەی ئەوەی پێ بەخشیوە دەسەڵاتی هەبێت.

- خوا بەهرەی ئەوەی پێ بەخشیوە توانا و هێزی خۆی بەسەر

خەڵکدا تاقی بکاتەوە.

ئەحمەد عارەب خەریک بوو هاوار بکات:

- خوا لەناوی ببات، شاڵڵا.. ئەمە کەی بەهرە و دەسەڵات وا دەبێ کە تەعەڕووزی ناموس و شەرەفی خەڵک بکەیت؟

- کەی بەهرە و دەسەڵات وا دەبێ کە سامانی خەڵک بەهەدەر ببەیت و دنیا لە زەواق بنێی!

لەگەڵ گەورەتربوونی من، ڕەئیس ڕەمەزانیش گەورەتر و بەسامتر دەبوو، ناودارتر دەبوو، ژمارەی زۆرتر دەبوو. تەنانەت ئەوکاتەی من گەیشتمە پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، ژمارەی ڕەئیس ڕەمەزانەکان لە شاری هەولێر «دەیانگوت» گەیشتۆتە بیست و حەوت ڕەئیس ڕەمەزان: دەهات لەگەڵ باوکەکان لە ماڵەوە لەسەر یەک خوان دادەنیشت و نانی دەخوارد.

ڕەئیس ڕەمەزان گەیشتبووە ناو مزگەوتەکانیش: دەچوو لە مزگەوتەکاندا خوتبەی جومعەی دەدا؛ بە ناوی خوا و دینەوە - لە بڵندگۆی غودبەکانەوە - خەڵکی بەگژ یەکترەوە دەنا، فەتوای دەردەکرد. بە ناوی تەفسیری قورئانەوە بەئارەزووی خۆی، هەرچی شتێک خۆی حەزی لێ نەبووایە حەرامی دەکرد؛ چی تاوان و گوناحێکیش خۆی بیویستایە حەڵاڵی دەکرد.

لەترسی ڕەئیس ڕەمەزان خەڵکێکی زۆر لەناو مزگەوتەکاندا کۆدەبوونەوە، نەمازە ڕۆژانێک ئەو غودبەی دەدا: خەڵک بۆ بیستنی غودبە و فەتواکانی، لەترسان، پارچە حەسیرێکیان لە ماڵەوەڕا لەگەڵ خۆیان دەهێنا و لەسەر شۆستە و شەقامەکەی دەرەوەی مزگەوتدا (لەبەرئەوەی لەناو مزگەوتدا جێگە وەبەر نەدەکەوت) لەژێر خۆیاندا ڕایاندەخست.

سەیر ئەوە بوو: ئەم ترس و سامەی ڕەئیس ڕەمەزان، لەناو دڵی خەڵک، سەبارەت بەوەی قووڵ و بەردەوام و هەموو دەم و ڕۆژێک دووبارە دەبۆوە، لەکۆتاییدا دەبووە باوەڕ. کار گەیشتبووە ئەوەی هەندێ خەڵک چۆن لێی دەترسان، ئاوهاش باوەڕیان پێی هەبوو و خۆشیان دەویست.

ڕەئیس ڕەمەزان هاتبووە ناو قوتابخانەکانیش، ڕۆچووبووە ناو جەستە و ڕۆحی ژمارەیەکی زۆر لە بەڕێوەبەر و سەرپەرشتیار و

مامۆستاکانیش. دەهاتە ناو پۆل؛ وانەی بۆ قوتابیانی پۆلەکانی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی ڕاڤە دەکرد.

(زیرەک) هەبوو، کوڕێکی هاوتەمەنی خۆم، لە پۆلی شەشەم، ساڵێک لەپێشەوەی من دەیخوێند، پرچێکی جوانی بەسەر خەنافسەکەیدا بەردابۆوە. ڕۆژێکیان لەناکاو ڕەئیس ڕەمەزان هاتبووە ناو پۆلەکەی، چاوی لە زیرەک زەق کردبۆوە:

- ئەم خەنافسە حیزە چیە بەرت داوەتەوە، دەڵێی جوولەکەی؟

زیرەک دەیگوت: «گوتم: مۆدیلە مامۆستا»؛ «هەر ئەوەندەم گوت و دیتم یەکسەر زللەیەکی تی سرەواندم، مقەستێکیشی لەناو باخەڵی دەرهێنا و لەشێوەی نیشانەی زەڕبێک کەوتە هەڵپاچینی سەروقژم».

زیرەک دەیگوت: «لە هەمان کاتدا سێ قوتابیی دیکەشی لەناو پۆلەکەدا هەڵبژارد و - نازانم لەسەرچی- ڕاپێچانە زیندان و دووای سێزدە ڕۆژ ئنجا یەکێکیان گەڕایەوە پۆل». ڕۆژێکیش، بەبیرمە، لەسەر تەلەڤزیۆن دەرکەوت، بە دەنگی بڵند گەفی لە هەموو قوتابیان

و خوێندکارانی زانکۆش کرد:
- با هەمووتان گوێتان لێ بێ! هەر کەسێک خەنافس بەربداتەوە، یان بیبینم لە سەر شەقام ئێواران هەر کەسێکتان بەدووای کچانەوە یان خەریکی پیاسەکردنە، یان هەر خوێندکارێکی کچ ئەگەر پانتۆڵ لەبەر بکات یان تەنوورەکەی فەتحەی هەبێت؛ قەسەم بە خوا.. دەیکەمە عیبرەت. گوێتان لێیە!».

ئەم هەڕەشە و گوڕەشانە وای لە خوێندکار و گەنج کردبوو لە هەر کونجێک ڕەئیس ڕەمەزان ببینن زەندەقیان بچێت؛ جادە و سینەما و شانۆ و شوێنە گشتییەکانیان لێ حەڕام ببێت.

(ئەژی) هەبوو، گەنجێکی جوانی کۆیی بوو، لە شوعبەکەی دیکە لە پۆلی پێنجەم دەیخوێند، ماڵیان لەودیو باخچەکەی کورد و عەرەب، پێکەوە لە تیپی (سەبعە نیسان) فوتبۆڵێنمان دەکرد، دەیگوت:

- ڕەئیس ڕەمەزان، ڕۆژێک دووای ڕاڤەکردنی وانەی جوگرافیا، لە دەرەوە ڕای گرتم و داوای لێکردم بچم دەمودەست دوو نەفەر کەبابی بۆ بکڕم و پاشان بۆی ببەمەوە ماڵەکەیان.

(ئەژی) دەیگوت: «پارەکەم لێی وەرگرت و سبەینێ دامەوە، پێم گوت: مامۆستا، کەبابخانە قەپات کرابوون». ئەژی دەیگوت: «عادەتی بوو کاری کەرپووچ کێشانەوە و توور و زلق کرینی ماڵەوەشی بە قوتابیان دەکا».

جارێکیش (ئەوکاتە پۆلی شەشەمی ئامادەیی بووم) هاتە پۆلەکەی ئێمەشەوە؛ بەبیرمە، بە دەنگێکی لەخۆڕازییەوە، شیڕاندی:

- دەبێ مامۆستا چیی پێ گوتن، بە قسەی بکەن! ئەگەر مامۆستا لێتان ڕازی بێ، خوا و پێغەمبەریش لێتان ڕازی دەبێ.

ئەوکاتەی من لە پۆلەکانی ئامادەیی دەمخوێند، باوکم زۆر جار تا نیوەشەوان لە چایخانەکەی میرهەلا، کە گەورەترین چایخانەی ناوبازاڕی هەولێر بوو، لەگەڵ برادەرە کوورەچی و قەصاب و دارتاش و زێڕنگرەکانی خۆی دەمایەوە. دووای بیستنی حەکایەتەکانی شیرین و فەرهاد و ڕۆستەمی زاڵ و ئاسلّی و کەرەم.. ماوەیەکی زۆر باسیان هەر باسی ڕەئیس ڕەمەزان بوو. هەندێ جار باوکم منیشی لەگەڵ خۆی دەبرد، هەندێ جاریش - کە منی نەدەبرد - کاتێ دەهاتەوە ماڵ، دیسان باس و خواسەکانی ڕەئیس ڕەمەزانی بۆ دایکم دەگێڕایەوە.

مام خەلیفەی دارتاش، دوو زارەکەی دەستی هەڵدایە ناو تاوڵەکەوە، چاو لەسەر داشەکان، بێ ئەوەی تەماشای کەس بکات، بە باوکمی گوت:

- ڕەئیس ڕەمەزان دەیەوێ هەموومان وەکو ئەو بین.

باوکم گوتی:

- معاونی پۆلیسە و بۆی دەلوێ ئیتر.

کەریم گوورێژ، برادەرێکی نزیکی باوکم بوو، پیاوێکی دەموچاو خڕیکاویی کورتەبنەی سوورە؛ دەچوو لەناو زێرابی ئاودەسخانەی مزگەوتەکانی ناو بازاڕ بەدووای کەلوپەلی ونبووی خەڵکدا دەگەڕا، کاتێ دەیدۆزینەوە ئیتر بۆ خۆی دەیفرۆشتنەوە. جاری وا هەبوو سەعاتی دەدۆزییەوە، جیزدانی دەدۆزییەوە، دیناری ئاسن یان ئەنگوستیلەی زێڕی دەدۆزییەوە.. ئیتر لەسەر ئەمە دەژیا. باوکم دەیگوت «ئەوەم پێ سەیرە؛ ئەم پیاوە بەدرێژایی ژیانیشی، قەت نەمدیوە ڕۆژێک بۆنی گووی لێ بێ؛ کەچی هەموو ڕۆژێکیش دەچێتە ناو زێرابی ئاودەسخانەی مزگەوتەکان». ڕاستییەکەیشی، من دەمدیت، پیاوێکی زۆر پاک و تەمیز بوو. سەرنجیشم دابوو، کەریم گوورێژ، عادەتێکی هەبوو: کاتێ قسەی تەواو دەکرد، لە کۆتایی قسەکەیدا بە گلەییەوە یان بە هەستێکی بێهوودەیی و بێباکانەوە دەیگوت «جانم».

ئەوڕۆژەش، لە وەڵامی باوکمدا گوتی:

- ڕەئیس ڕەمەزان ئیتر بۆ خۆی هەموو شتێکە.. جانم.

پاشان هەر خۆی، درێژەی بە قسەکانی دا:

- خۆ ئێوەش، ئەگەر بەرپرسێکی گەورە بوونایە و حکوومەت ئاوها لەپشت فەرمایشتەکانتان بووایە، هەر ئاوهاتان دەکرد.. جانم.

- باشە کەم کەس هەن بەرپرسی حکوومەتیش نین و لە ڕەئیس ڕەمەزانیش خراپتر دەکەن؟

نەسرەت زێڕنگر، کە جارێکیان گوێم لێ بوو دەیگوت (منداڵەکانم لە ماڵەوە ئەوەندە لێم دەترسن پێم دەڵێن «ڕەئیس ڕەمەزان»، ئاوها وەڵامی مام خەلیفەی دایەوە:

- ئەم نەوعانەی تۆ دەڵێی تەنیا مەگەر نانێکیان لەگەڵ ڕەئیس ڕەمەزان خواردبێ!

- مەبەستت چیە؟ ئنجا کێ هەیە لاسایی ڕەئیس ڕەمەزان نەکاتەوە؟ کێ هەیە...؟!

باوکم وەک ئەوەی لەبەرخۆیەوە قسە بکات، گوتی:

- بەڵێ. دەسەڵات هەمیشە مەغروورت دەکا.
کەریم گوورێژ گوتی:
- مام پیربال ڕاست دەکا: هێز هەمیشە مەغروورت دەکا.
مام خەلیفە دەنگی نارەزایی هەڵبڕی:
- نا، نا، نا...
- چی؟!
- وەڵا من فەرمانبەرێکی گەورەش بوومایە، باوەڕ ناکەم یەکجار ئاوهام بکردایە: دارعەسایەکی درێژ بگرمە دەست و لەناو بازاڕ، شەلم کوێرم ناپارێزم، هەرچی عارەبانەیەک بێتە سەر ڕێم، ئاوەژووی بکەمەوە، خاوەنەکانیشیان بە تف و جنێو پەلبەست بکەم و ڕایانپێچمە بەندیخانە.. چیە ئەوە؟ وەڵا..
نەسرەت زێڕنگر هەڵیدایێ:
- لەبەردەم (باتا) بەبەر چاوی ئەو هەموو خەڵکەوە، گۆرانیبێژێکی تورکمانی بەستەزمانی داوەتە بەر شەق و شوللاق لەسەرئەوەی لە

ئەگلەنجەیەکدا باسی سینگ و بەرۆک و سمڵ و دەست و پەنجەی باس
کردووە!

سابیر سەماوەر، پیاوێکی سپیکەڵەی خڕکەڵەی تورکمان بوو، کاتی خۆی چایچی بوو، بەڵام پاشان چایخانەکەی لەپشت دوکانی بازگی تێکدا و هەر لە هەمان جێگەکەی خۆیدا لەنگەی دەفرۆشت - بەبێ هەموو شەوێک پێش هەموو کەسێکی ئەو جەماعەتەی ناو چایخانەکە هەڵدەستا و دەگەڕایەوە ماڵ-: جووتە زاری تاولەکەی لەناو دەستی خۆیدا ڕاگرت و ڕووی لە جەماعەت کرد:

- ئەگەر من شتێکی دیکەتان بۆ بگێڕمەوە، باوەڕ بە قسەکەم دەکەن؟

«جەماعەت» هەموویان تەماشای دەمی سابیر سەماوەریان دەکرد:

- پێش چەند هەفتەیەک، بەبیرتانە گوتیان پیاوێک لەبەردەم دائیرەی دابەشکردنی ئەرزاق خۆی تەقاندەوە!؟

- ئا، ئا.. سێ پۆلیس و یازدە کەسی دیکەی کردە قوربانی؟

- ده ئەو پیاوەی خۆی تەقاندبۆوە، ئەویش هەر ڕەئیس ڕەمەزان بوو.

نەسرەت زێڕنگر قسەکەی سابیر سەماوەری بەڕاست گەڕاند:

- بەڵێ، هەزار سوێندیان دەخوارد، دەیانگوت: «بە چاوی خۆمان بینیومانە، ڕەئیس ڕەمەزان بوو..».

- ڕەئیس ڕەمەزان دەیەوێ ئێمە هەموومان وەکو ئەو بین لەگەڵ یەکتر.

- دەیەوێ هەمووومان بکەوینە گیانی یەکتر.

- ئەو دەیەوێ میللەت هەموو لێی بترسێ.. جانم.

- دەیەوێ هەمووومان ببینە کۆیلەی ئەو، کۆیلەی یەکتر.

مام داودی حەسیرفرۆش، لەناو قسەکانی هەموویاندا، ئەویش، فەقیر فەقیر، ئەم قسانەی لە دەم بەربووەوە (مام داود کاتێ قسەی دەکرد، هەمیشە وام هەستدەکرد دەگریێ):

- ئەو ڕۆژە لەلای مەرقەدەکەی سەید تەها، لەناو بازاڕی قەیسەری،

بەبەر چاوی خەڵکەوە، بە دار حەیزەران کەوتە گیانم، کەڵەوازی کردمەوە..

- ئنجا لە هەمان سات و دەقیقەی تۆشدا، لە تەعزیەکەی مام نادری بنجوو، لەناو مزگەوتی خانەقاوە (کە کەمێک لەولاتری دوکانەکەی تۆوەیە) چوار دوکانداری دیکەی ڕاپێچی بەندیخانەی سەرا کردبوو..

- باشە، ئەم پیاوە بۆچی ئەم کارانە دەکات؟ ئامانجی چیە؟

نەسرەت زێڕنگر ئاوها وەڵامی مام خەلیفەی دایەوە:

- هەموو کەسێکی زاڵم، هەموو دەسەڵاتدارێکی خودڕا حەزدەکات بەردەست و سیخوڕ و شاگرد و نوێنەرەکانی خۆی لە هەموو شوێنێک هەبێ. وایە؟

باوکم درێژەی بە قسەکانی دا:

- دەیەوێ هیچ تاکەکەسێک، هیچماڵێک، ئازاد و ئاسوودە و سەربەخۆ نەژین.

مام داودی حەسیرفرۆش گوتی:

- بەڵێ، دەیەوێ هەموومان لەژێر دەستی ئەودا، لەژێر سام و ترسی ئەودا ڕەفتار بکەین.

نەسرەت زێڕنگر گوتی:

- ئنجا بەڕاستیش ئەو لە هەموو شوێنێکە.

- لە هەموو شوێنێکە.

کەریم گووڕێژ بە زەردەخەنەوە گوتی:

- دەیەوێ بێچوو بۆ خۆی بنێتەوە.. جانم.

من چەند گەورە و گەورەتر دەبووم، ڕەئیس ڕەمەزانیش چەند ڕەئیس ڕەمەزانێکی دیکەی لێ دەردەکەوت. هەفتە بە هەفتە و مانگ لەدووای مانگ چەند ڕەئیس ڕەمەزانێکی دیکەی لێ دەکەوتەوە. هەر ساڵێک چەند ڕەئیس ڕەمەزانێکی نوێ لە چەند گەڕەکێکی دیکەدا پەیدا دەبوون.. تا وای لێ هات ڕەئیس ڕەمەزان گونداوگوند و شارۆچکەوشارۆچکە و شارەوشاریش دەڕۆیشت.

کاتێ گەیشتمە پۆلی یەکەمی زانکۆ لە کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سلێمانی، دیتم: لە شاری سلێمانیش، ڕەئیس ڕەمەزان گەیشتبووە ناو هەموو ماڵێک، چووبووە ناو هەموو قوتابخانە و کۆلێژ و دامودەزگایەک، گەیشتبووە ناو هەموو بازاڕ و باڕ و باخچە و دوکان و تەنانەت هەموو باخچەیەکی منداڵانیش. وای لێ هاتبوو ڕەئیس ڕەمەزان لە یەک چرکەدا لە (١٥٠) شوێن زیاتر دەبینرا. بۆ نموونە لە کاتژمێر دوازدە و نیوی نیوەڕۆ لەناو کۆلێژی ئەندازیاری کۆبوونەوەی

بە سەرۆک بەشەکان دەکرد، لە هەمان کاتدا هەر خۆی لەناو باخچەی سەندیکای ڕۆژنامەنووسان دانیشتبوو و ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژنامەنووسەکانی ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن -لەترسان- بۆیان پان دەکردەوە و مەدح و سەنایان دەکرد؛ ئنجا لە هەمان چرکەدا لەناو مزگەوتی شارێکی دیکەدا غودبەی دەدا لەبارەی ئەوەی کە دینی تیرۆریستە ئیسلامییەکان دینی ڕاستەقینە نیە و ئەمانە ئیسلامی ڕاستەقینە نین و پێویستە خەڵک ڕێگای ئیسلامی ڕاستەقینە بگرنە بەر و گوێ لە سروودی «موطنی موطنی..» ڕابگرن نەک «ئەی ڕەقیب»؛ لە هەمان ساتیشدا لەناو هۆڵی کۆلێژی زانستیی زانکۆی شارێکی دیکەدا خوێندکارانی کۆکردبۆوە و گەفی لێ دەکردن کە جارێکی دیکە خۆپیشاندان سازنەکەن؛ لە هەمان کاتیشدا، ڕەئیس ڕەمەزان، عەینەگ لەچاو، دارحەیزەرانێک بەدەستەوە، لە ناوەڕاستی مەیدانی «تحیە علم»ی قوتابخانەیەکی ئامادەییدا، دەیشیڕاندە سەر سەدان قوتابی:

- من موديرم، پێویستە هەمووتان گوێڕایەڵی فەرمایشتەکانی من بن: نابێ هیچ کەسێک لە قسەی باوک و مودیر و مامۆستا و ڕەئیسی خۆی دەربچێ! تێگەیشتن!

ڕەئیس ڕەمەزانەکانەکان هێندە زۆر و زەبەند و بەهێز ببوون، خەڵک لە یەکتریان دەپرسی: «تۆ بڵێیی ئەم ڕەئیس ڕەمەزانانە لەناو خۆیاندا، لەگەڵ یەکتر بەشەڕ نەیەن؟!».

- خۆ هەر دەبێ یەکێکیان لەناو هەموویاندا لەگەڵ یەکێکی دیکەیان ناکۆک بێ!

- چەنێک لەگەڵ یەکتر ناکۆکیش بن، بەڵام پشتی یەکتر بەرنادەن.

نا، باوەڕ ناکەم: لەگەڵ یەکتر بەشەڕ نایەن.

- بەشەڕیش بێن، یەکتر ناکوژن.. «براکوژی» ناکەن.

- براکوژی بە بچووکەکانیان دەکەن و... خۆشیان ژێراوژێر دەست لەدەستی یەکتر، یەکتر دەپارێزن.

دەیـان پرسـیار و وەڵام و قسەی دیکەی لەم جۆرانە...... بەڵام من تەنیا ئەوکاتەی گەیشـتمە زانکۆ ئنجـا توانیم وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەمـەوە و ڕەئیس ڕەمـەزان باشـتـر بناسم، یان بەلای کـەمـیـیـەوە - ڕاسـتـتر بڵـێم- کـەمـێـک باشـتـر لێی تێ بگەم. من لەکـۆتاییدا تێگەیشتم کە ڕەئیس ڕەمەزان نە وەلییە، نە جادووگەر؛ نە سیحرباز، نە ئەجندەیشی هەیە.

لە زانکۆ چاوم کـردەوە و دیتم: ڕەئیس ڕەمـەزان دەتوانێ بەئاسانی بەناو هەمـوو یەکـێک لە ئێـمەدا ڕۆبچـێت و لەناو هەمـوو یەکـێک لە ئێمەدا گەرا بنێـتەوە؛ دەتوانێ هەر یەکـێک لە ئێـمەی ئاسایی بکاتە خۆی و بەکارمان بهێنێ: بمانکاتە ڕەئیس ڕەمەزانێکی دیکە.

هەموو جار قسەکەی باوکمم بیر دەهاتەوە، دەیگوت:
- ڕەئیس ڕەمەزان حەزناکات هیچ کەسێک جیاواز بیر بکاتەوە.
من منداڵ بووم دەمگوت: چۆن؟

دەیگوت: کوڕم، ڕەئیس ڕەمەزان بچێتە گیان و جەستەی هەر کەسێکەوە ئیتر ئەو کەسە دەکاتە کۆیلەی خۆی و.. دەشیەوێت هەموو کەسەکانی دیکە ببنە کۆیلەی ئەو.

جارێکیش لە باوکمم پرسی:

- باشە، بابە، ڕەئیس ڕەمەزان وەلییە یان ئەجندەی هەیە؟

باوکم، بەبیرمە، ئاوها وەڵامی دامەوە:

- کوڕم، هەر کاتێک کەسێک قبووڵی کرد جیاواز بیر نەکاتەوە، هەر کاتێک کەسێک ڕازی بوو بەوەی ئازاد نەژیت و ئازادانە بیر نەکاتەوە.. ئەوا ڕەئیس ڕەمەزان زەفەری پێ دەبات و دەیکاتە هی خۆی.

ئنجا گوتی:

- هەر ئاوهایشە کە ڕەئیس ڕەمەزانێکی دیکە زیاد دەکات..

